# سواره لە نێوان دوو ئەزموون و دوو شێوە ژیانی جیاوازدا

**ئەمجەد غوڵامی**

## 1

بزوتنەوەی شێعری نوێ لە کوردستاندا، وەک زۆربەی بزوتنەوەکانی دیکە بەر لەوەی خوێندنەوەیەکی بە کۆمەڵ پەرەخسێنێ، کۆمەڵێک مشتومڕی دژکارانەی لێکەوتووەتەوە و ئەوەش بە گوێرەی ئەم نووسراوەیە لە پاڵ ناشارەزایەتی و پاشکەوتوویی کۆمەڵگای ئێمە بۆ ئامادەکردنی بەردەنگی بە توانا، سەرچاوە لە شێوەکانی بارگاویکردنی ئەزموونی ڕۆژانەی خودی شاعیر بۆ ئەزموونێکی بە کۆمەڵ دەگرێ. ئەم دوو ئەزموونە کە لە فەلسەفەی ئاڵمانی وەک ئەزموونی ژیندراو (Erlebnis) و ئەزموونی بیرلێکراوە و بەکۆمەڵ (Erfahrung) ناوی لێدەبرێ، بە وتەی والتێر بنیامین: گیرۆدەی جۆرێک لێکداپڕانن و لەمناوە سووژەی مۆدێرن نە تەنیا شایەدی چڕبوونەوەی لە پەستاکەی ئەزموونی ژیندراو و ڕۆژانەیە، بەڵکوو چیتر هەست بە دانوستان لە نێوان ئەم دووانە و گرێخوارنەوەی ئەزموونی ڕۆژانەی بە ئەزموونی بیرلێکراوە و بە کۆمەڵ ناکا (اشتاین، 1382: 93).

بنیامین لە وتاری "حەقایەتبێژ: کۆمەڵێک تێبینی لەسەر بەرهەمەکانی نیکۆلای لێسکۆف" (1375) دوای بیرخستنەوەی بێبایەخبوونی ئەزموونەکانی ژیانی مۆدێرن جەخت لەوە دەکاتەوە کە سەردەمی ئەمڕۆ سەردەمی حەقایەتبێژی نییە و حەقایەتبێژی بابەتێکە لە ڕابردوو کە دەیتوانی بە چەندپاتەکردنەوەی حەقایەتەکان، ئەزموونەکان رابگوێزێ و بەمجۆرە لە گەڵ گێرانەوەی حەقایەتێک، ئەزموونەکان ڕادەست دەکران و ئەزموونی ڕادەستکراوە وەک حیکمەتی سەردەم، مێژووی سەریەک دەخستەوە ... کەچی سووژەی مۆدێرن شتێکی لێستاندراوەتەوە کە دەبێتە هۆی نامۆبوونی، شتێک کە ئاسوودەترین شوێنی نیشتەجێبوونی ئێمە بوو، [ئەویش چ نەبوو جیا لە] توانستی دانوستان پێکردنی ئەزموونەکان (بنیامین، 1375: 4).

ئەوەی لە خوێندنەوەی بنیامین دەردەکەوێ نەک نەبوون یان کەمایەسیی ئەزموون، بەڵکوو ئامادەنەبوونی توانستی دانوستان پێکردنی ئەزموونەکانە. یان بە واتایەکی‌تر چەندایەتیی ئەزموونەکانی مرۆیی گرفتی بنیامینی نییە و بگرە مرۆڤ چ لەو سەردەمەدا و چ لە ئێستادا، ڕەنگە بە نیسبەتی تەواو سەردەمەکان، ئەزمووونی زیاتری لەبەر دەستدابێ. کەواتە گرفتی سەرەکی لێرەدا چۆنیەتی ئەمباروئەوبارکردن و تێپەڕبوون لەو ئەزموونانە و جێ‌کردنەوەیان لە ناو ماناکانی ژیانە، و بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ ئەزموونەکان بۆ ئەزموونێکی بە کۆمەڵ بارگاوی بکرێن، هەتا ژیان مانامەند بێ و ئەو دەرفەتە پەرەخسێ کە ئەزموونەکان لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ. کەواتە شەڕی سەرەکی بنیامین و ڕەنگە پرسی سەرەکی ئەم نووسراوە گەیشتن بەو دەرفەتەیە کە وەک خاڵی گرێ‌خواردنەوەی مرۆڤ بە ڕابردوو (چ وەک یادەوەری و چ وەک بیرئانین) باسی لێ‌دەکرێ: وەک یادەوەری هونەری و بیرئانینی مێژوویی.

لێرەدایە کە بنیامین بۆ دەستەبەرکردنی وەڵامێکی پێویست بۆ دەرفەتی گرێ‌دانەوە، ئاوڕێکی جیدی دەداتەوە لە شێعری بۆدلێر و هەر لە وتاری "سەبارەت بە کۆمەڵێک دەسکەوت و تێمەکانی ناو شێعری بۆدلێر" (1377) بەو ئەنجامە دەگا کە سازدانی دەرفەتێکی لەبار بۆ دانوستان پێ‌کردنی ئەزموونەکان خراوەتە ئەستۆی شێعر، هەتا شاعیر بە پشت‌بەستن بە ئەزموونی شاعیرانەی خۆی و بە غەیاب‌دان و تەریک خستنەوەی کاتێکی زەمانی و تایبەت، و بە گێڕانەوەی ئەو کاتە تایبەتە وەک هاوچەشن‌سازییەک بۆ کاتە لە دەست‌چووەکان و کاتە بە لێشاوەکانی جەماوەری بەردەم، بتوانێ ئەزموونەکانی لە ناو ئەزمونێکی تایبەتیدا چڕ کاتەوە و فۆرمێکی تایبەت بۆ خۆی دیاری بکا (بنیامین، 1377: 29).

فۆرمێک کە چ نییە جیا لە فامکردنی چۆنایەتی ئەزموونی کاتێکی تێپەڕبوو، کاتێک کە بۆدلێر وەک "ئێوارەیەک" لە شێعری "ڕێبوارێک"دا نیشانی دەدا (ئا.بنیامین، 1377: 232). ئەم هاوچەشنییە بۆ دەست‌داگرتن بە سەر ئەزموونی بە کۆمەڵ لە ڕێگەی ئەو ئەزموونانەی کە چییەتی ژیانی هەر کام لە ئێمە بەوەوە گرێی‌خواردووە، بە

گشتی پرسی سەرەکی ئەم نووسراوە و هاوکات یەکێکە لە گرفتە سەرەکییەکانی شێعری کوردی دوای نوێبوونەوەی هەتا ئەمڕۆ و بە تایبەت لە شێعری بەرەی هاوچەرخدا.

هەر چەند ڕەنگە پێشتر کۆمەڵیک بابەتی وەک جەنگ و مەنفا و خودی بابەتی نەتەوە، توانیبێتیان بەشێک لەو گرفتانە کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێدرا، چارەسەر بکەن، بەڵام لە ئەمڕۆدا خودی ئەو بابەتانەش وەک کەمایەسییەکی نوێ، گرفتەکەیان چەند هێندە کردوەتەوە. کەمایەسییەک کە بە دووفاقەبوونی ئەزموونی ڕۆژانەی ئێمە و ئەزموونی زاڵ و ئەوەی لە میدیاکاندا بڵاو دەکرێنەوە، پەوی بە جۆرێک ئەزموونی کەمتەرخەم و گوزەری داوە، کە لە نەریت وەک غەیابێک دەڕوانێ و بێبەرییە لە تەواو تایبەتمەندییەکانی زەمانی. لە ئاوەها دۆخێکدایە کە بابەتی شێعر دەبێتە پێوەرێکی شیاو بۆ چۆنیەتیی فامکردنی ئەو غەیابە و نەک ئارەزووی گەڕانەوە بۆ شتە لە دەستچووەکان. غەیابێک کە لە ئەمڕۆدا خۆی وەک غەیابی "بەردەنگەکان" دەرخستووە و بەو پێیە ئەرکی شاعیر گێڕانەوەی ئەزموونەکانی خۆی و دواتر گواستنەوەیان بۆ ئەزموونی بەردەنگێکە کە لە ڕێگەی ئەزموونی شاعیرەوە گرێ دەخواتەوە بە کۆی ئەزموونی مرۆیی و هەر ئەمە دەبێتە پاڵپشتێک بۆ دانوستان پێکردنی ئەزموونەکانی.

**2**

ئێستاش بۆ لێکدانەوەی چۆنیەتی هەڵسوکەوتی شاعیرانی خۆماڵی لە هەمبەر ئەو کەلێنەی کە لە نێوان دوو ئەزموونی ڕۆژانە و بە کۆمەڵدا ساز بووە، دەڕوانینە دوو بەرهەمی شێعری سوارە ئیلخانی زادە و توانستی ئەو لە سازدانی کۆمەڵگای بەردەنگ.

سوارە وەک شاعیر لە هەمان‌کاتدا کە یەکێکە لە بنیات‌نەرانی شێعری نوێی کوردی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، یەکێکە لەو دەنگە سەرەتاییانەی کە بە گوێرەی ئەم نووسراوە لە دژی نزمبوونەوە و دابەزینی ئەزموونەکان تا ئاستی ئەزموونێکی ڕۆژانە و بەری لە حیکمەت وەستاوە و ئاستی پرۆگرامەکانی ناو "تاپۆ بۆ مەلێڵ" و کەلان

پێکهاتەی مانایی حیماسی ئەو دەقانە سەلمێنەری ئەو راستیەن. واتە ئەو کاتەی سوارە ئەزموونەکانی نووسین و شاعیری گرێدەداتەوە بە فۆلکلۆر، شێعری بەرەکانی پێشتر، مێژوو، ئەدەبی دراوسێ، سیاسەت و کۆمەڵگا بە جۆرێک لە جۆرەکان حەوڵی هەمەلایەنەکردنی "حافزەیەکی هەرمان" (کە چ نییە جیا لە هەمان حافزەی حیماسی) و بارگاوی کردنی ئەزموونەکان و دانوستان پێکردنیان دەدا.

کەچی خودی ئەم حەوڵە، حەوڵێکی دژوازانەیە کە لە لایەکەوە بە تێکەڵبوونی بە شەپۆلی بزووتنەوەی خوێندکاری و ئایدیالۆژی، لە دژی شێوازی چەقبەستووی ئەزموونی باوکسالاری و نەریتخوازی دەوەستێ و حەوڵەکە بە باری پراکتیگخوازانەدا دەشکێتەوە هەتا دەرفەتی گرێدانەوە لە قەوارەی ڕۆحێکی دژخوازانە دەرکەوێ و لە لایەکی دیکەوە دەبێتە ئاراستەیەک بۆ گەڕانەوە بۆ ئەزموونێکی تایەکاری و تاکخوازانە و جیاواز کە بە شێوەی خۆتاراوەکردن و نەخۆشی و کەمئەندامی و دواجار بە شێوەی حەزێکی رۆمانتیک بۆ گەڕانەوەی دووبارە بۆ ناو هۆز و عەشیرە و ژیانی پاستۆراڵ، خۆی دەنوێنێ.

ئەم میتافیزیای دژایەتی و گەڕانەوە، پێکهێنەری دوالیستی زاڵ بە سەر تەواو ئەزموونەکانی نووسین لای سوارەیە و لە هەمانکاتدا مێدیۆمێکی تایبەتە بۆ بارگاوی کردنی ئەزموونی رۆژانە و ژیندراوی ئەو بۆ ئەزموونی بەردەنگ و پاشان بۆ ئەزموونی کەڵەکەکراو و بیرلێکراوەی ناو کۆمەڵ. مێدیۆمێک کە بە ڕاشکاوی دەکرێ مێژووەکەی بۆ دەنگە سەرەتاییەکانی شێعری کوردی وەک نالی و مەحوی بگەڕێندرێتەوە و وەک رێبوار سیوەیلی دەڵێ: بەردەوام لە نێوان منی شاعیر وەک چەشن و منی شاعیر وەک ڕەگەز؛ من وەک شاعیر و من وەک بەرپرسی کۆمەڵایەتی؛ و دواجار وەک حەوڵێک بۆ ژیان و بوونی تایبەتی و خۆماڵی و بوونی بە کۆمەڵ لە هاتوچۆ دایە (سیوەیلی، 2008: 498 و 499) و ڕەنگە سەرکەوتووترین دەقە شێعرییەکانی ئێمە دەسکەوتی ئەم گەمە میتافیزیایە بن کە بڕیارە وەک خاڵی شاز و تایبەتی لای سوارە باسی لێبکرێ.

بەرچاوترین بەرهەمە شێعرییەکانی سوارە بۆ لێکدانەوەی بابەتە ئاماژە پێدراوەکانی سەرەوە، ڕەنگە شێعرەکانی "خەوە بەردینە" و "شار" بن. بە ڕادەیەک کە گەر ئاستی دژوازییەکە لەوی یەکەمدا خاوەن ڕواڵەتێکی ژێستگەرانە بۆ گەیشتن بە بوونی بە کۆمەڵ و لە هەمانکاتدا سیمبۆلیستی بێ، شێعری دووهەم حەوڵێکە بۆ گەڕانەوە بە بوونی تایبەتی و خۆماڵی. ئاوەها کە شاعیر لە شێعری خەوە بەردینە بە ریوایەتکردنی سەفەرێک هەتا ئاستی دەریا و گرفتەکانی بەردەم ئەم سەفەرە، بەو خاڵە دەگا کە بە کەڵك وەرگرتن لە شێوازی تەمسیلی و حەقایەتبێژیی سەفەر و چەندپاتەکردنەوەی هاتوچۆکان خۆی کامڵ بکا و ئەو راستییە دەربخا کە هەرچی کامڵبوونە، دەوڵەمەندە بە تەواوکەرێک لە ناخی خۆیدا. کەچی بەوەشەوە نابەردەوامێتی و وەنەوزدان تاقە حاڵەتێکە بۆ چەقبەستن و ڕووخانی پێگەی بە کۆمەڵبوون:

بەڵام داخی جەرگم لە گەڵ هەر بەهارێ/ کە ڕائەچڵەکن سەوزەڵانی/ لە خاکینە خەونی گرانا/ لە دڵما خەم و داخی ئەم دەردە سەوزە/ کە دەردی گرانی هەموو رێبوارێ وەنەوزە ... (ئیلخانی زادە، 1372: 20)

بەم شێوە سوارە لەو وەسفەی کە بنیامین بۆ تایبەتیبوونی هاوچەشنسازییەکانی سرتە لە گەڵ ڕابردوو لە گەڵ جێگرکردنی ئەزموونی ڕەسەنی ئەوان لە ژیانی ڕابردوودا دەیکا، نزیک دەبێتەوە. ئەویش بە یارمەتیی ئەو سیمبۆلیزمەی کە لە هێماکانی ئەشکەوت و گژ و گیا، هەور و شەپۆل و دەریاوە سەرچاوە دەگرن و لە قەوارەی "زنەی دەم بە هاواری هاری درۆزن" و "گرماندنی هەوری ناو دڵ و دەروون" و "وەجاخێ کە ڕووگەی هەزارن نزای شینە باهۆی بە تاسە"ەوە دەرکەوتوون. یان بە واتایەکیتر ئەم هاوچەشنییە کە سەرچاوە لە سیمبۆلیزمی زاڵ بەسەر نووسراوەکانی سوارەوە دەگرن، ئاماژەدەرێکە بە دەستەبەرکردنی ئۆتۆماتیکی ئەوەی وا بە هێما کراوە، لە رێگای خۆدی هێماکان. ئاوا ئەزموونی ئەمیان، ئەزموونی

ئەوی دیکەیە و ئەوەی لە بەر دەستدایە، ئەوەی وا لە بەر دەستدا نییە داپێن دەکا. کەواتە بە هێما کراو لە ناو دڵی هاوکاتێتی ئامادەیە.

ئاندرێ بنیامین کاتێک دەڕوانێتە خوێندنەوەی بنیامین لە هاوچەشنییەکان لای بۆدلێر، ئاماژە بە کەلێنێک لە ناو ئەزموونەکان دەکا و دەنووسێ: هاوچەشنێتی، ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەزموونی هەنووکە چ نییە جیا لەو شتەی کە ئیتر ئیمکانی ئەزموون کردنی بۆ نییە و وەک کەمایەسی و فۆقدانێک دەردەکەوێ و کاتی ڕابردوو سەلمێنەری نائامادەبوونی هەمان شتە لە ئێستادا. لە ناو ئەزموونی ئێستاشدا هیچ چەشنە گەڕانەوەیەک شک نابەی و ئەوەی ونبووە ئیتر ئۆبژیەک نییە لە یادەوەریدا (ئا.بنیامین، 1377: 232).

کەواتە بە پێرەوی ئەم بۆچوونە، خەوەبەردینە گێرانەوەی ئەو ئەزموونە تایبەت و چەندپاتەکراوەی ڕابردووە کە تووشی فۆقدان هاتووە و حەوڵی ئەوە دەدا بە گرێدانەوەی بەردەوامی خۆی بە نەریت و هێماکانی نەریتی، کەمایەسییەکان قەرەبوو کاتەوە. بەڵام دەسکەوتەکەی چ نییە لە کەمایەسییەکی گەورەتر، کە وەک وترا، لە خۆیدا ئاراستەیەکی مۆدێرنە و نامومکینبوونی سەریەکخستنەوە و لەخۆنامۆیی دەگەیێنێ:

ئەزانی لە پێ ناکەوێ پێیە پێڵاوی تاسەی پیاسەی لە پێ بێ/ نەوەستان ئەوەستێ بە دەستێ/ کە خاراوی ئێش و سواوی سوێ بێ/ لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە/ ئەزانێ ئەبێ هەر بژی و باژوێ، تا بژی تا بمێنێ/ هەناوی بە هەنگاوە، نەسرەوتنە کوولەکەی ڕۆحی ئاوە. (ئیلخانی زادە: 23)

ئاوا سوارە حەوڵی زاڵبوون بە سەر ڕووخان و لەمپەرەکان دەدا و ئەوە دەسەلێنێ کە ونبووەکان چیتر ناگەڕێنەوە، بەڵام ونبووەکان ئیمکانی ئەزموون کردنێک سەردەخەن کە بنیامین وتنی ئەزموونی رۆژانە بە ڕاتەکانەکانی، تووشی مەترسی نایەن و گرێ دەخۆن بە شێوازێکی ڕەسەنتر لە جوانی کە هەمان "ئۆبژەی ئەزموون لە کاتی وێکچوون"ە (ئا.بنیامین: 233). شێوازێک کە بە تەکنیکی وەدەرنگ خستنی درێژ مەودا (prolonged hesitation) لە نێوان دەنگ و مانای شێعری ئاراستە

دەکرێن. ئاوەها کە لە گەڵ هەر بەندێکی شێعری و لە گەڵ تەواوبوونی دەنگەکان، باری مانایی شێعری کۆتایی پێ نایە و پێش دەکەوێ و خوێنەر بۆ پارچەیەکی‌تری شێعری ڕێنوێنی دەکا و سەروا بەر لە تەواوبوونی مانای ڕستەکان کۆتاییان پێ‌دێ و خوێنەر ناچارە لە زەینی خۆیدا دیالەکتیکێک لە نێوان دەنگ و ماناکن دروست دەکا و دەرئەنجامەکەی سازبوونی چێژێکی ئەستوونی ماناگەرانە لە هەمبەر چێژێکی ئاسۆیی دەنگ‌گەرانەیە. واتە دەنگەکان لە باری ئاسۆییدا، بۆ گەیشتن بە مانا و خۆپاراستن لە چەق‌بەستوویی، خێراییەک لە خۆ دەگرن کە جار هەیە بە سەر یەکدا سوار دەبن و گەلێ‌جار لە شێوەی واج‌ئارایی و جیناسدا دەردەکەون.
ئەم ئانتاگۆنیزمە شێعرییە بە خۆ کێش‌دان و درێژەدادڕی مانایی لە پارچەیەکی دیکە، لە کاتێکدا کە حەوڵی هاوپۆشیی مانایی لە دەلاقەی هاوپۆشیی دەنگەکان دەدا، دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی مانای کۆتایی لە یەکە یەکەی پارچە شێعرییەکان. ڕێک وەک بەرامبەرسازییەک لە نێوان سەرەوای سەرەتایی "گەرووی کەو" و "کوولەکەی ڕۆح" لە کۆتایی شێعرەکە. هەروەها وەک چەندپاتەبوونەوەی هەمان مانا لە یادەوەریی شاعیر و نەریتدا. ڕەمزمێک کە لە ناوی خودی شێعرەکەدا واتە "خەوە بەردینە"دا دەبیندرێ: خەونێکی بەردین و تەلەسمێک کە بووەتە هۆی چەق‌بەستن و پێش‌خستنی ئەزموونەکان و گیرۆدەبوون بە ژیانێکی چەنەپاتەکراوە، نەک بۆ باوەشی نەریت بەڵکوو بەرەوە ژیانێکی بەردینەیی و بە شمەک‌بوون.

**4**

سوارە لە شێعری شاردا، بە گرتنەبەری هەڵوێستێکی سیمبۆلیستی لە دژی شار دەوەستێ و بێزراوی خۆی لە ڕێگەی ئارمانی و یۆتۆپیایی کردنەوەی گوند و لادێ دەردەبڕێ و ئاراستەیەک بە دەستەوە دەدا کە گەر بمانەوێ وەک "بێری ریجاردز" بە شێوەیەکی دەروون‌ناسانە پێناسەی بکەین و ئارەزووی گەیشتن بە هەر کامیان وەک درێژەی ئەندامەکانی لەشینە وێنا بکەین، بێ سێ و دوو دەبێ بیر لە دوالیزمێک لە نێوان شار و دێدا بکەین کە داپران لەمیان، دەوڵەمەندکردنەوەی ئەوی دیکەیانە، کەواتە شار لەم گەردوونەدا وەک دیترهاوێژییەک (Projection) بووەتە

بەستێنێکی پڕ لە مەترسی و پڕ لە ناپاکی، خنکێنەر و شپرزە و نائاسایی و ... . لەم دیترهاوێژییەدایە کە دژکارانەترین تایبەتمەندییەکان ئاراستەی شار دەکرێن و شار وەک "ئۆبژەیەکی نادڵخواز" دەردەکەوێ (ریچاردز، 1382: 108 و 109). کەواتە بێزراوی لە شار لە پەنای تەواو گرفتەکانی تایبەت بە خۆی سەرچاوە لە دیترهاوێژییەک دەگرێ کە دواجار بە شێوەی مێهروقین (Ambivalence)، بابەتی دژکارانە دەکاتە ئۆبژەیەکی ئۆخژنهێنەرانە، یان وەک ریچاردز دەڵێ: ئەو خەیاڵە دژکار و نێگەتیڤە هەمان تەواوکەری ئایدیاڵسازیی شار و هاوێریەتی، واتە بەم پێناسەیە سووژەی شاری مۆدێرن بەردەوام لە نێوان دووهەستی دژواز هەلسوکەوت دەکا (پێشوو: 110).

ئەمە لە کاتێکدایە کە شار بە مانا مۆدێرنەکەی هێشتا لای ئێمە ساز نەبووە و ئەمەش وەک مارشال بێرمەن دەڵێ، بیرهێنەرەوەی: مۆدێرنیزمێکە کە بە پێچەوانەی مۆدێرنیزمی وڵاتانی پێشکەوتوو ـ کە کۆمەڵگای خۆیان بە پێوەری ماتریاڵەکانی مۆدێرنیزاسیۆنی سیاسی و ئابووری بنیات ناوە و بە پشتبەستن بە واقیعێکی مۆدێرنیزەکراوە ئینێرژی و ئایدیاڵەکانی خۆیان لێوەرگرتووە ـ، سەرچاوە لە پاشکەوتوویی و گەشەنەسەندوویی دەگرێت کە سەرلەبەری وڵاتانی جیهانی سێهەم پێوەی گیرۆدەن: مۆدێرنیزمێک کە لە سەر بنەمای خولیاکان و خەیاڵەکانی مۆدێرنیتە دامەزراوە و خۆی بە تێهەڵقورتاندن و نزیککردنەوە لە تەراویلکە و تارەماییەکانی تێرئاو دەکا. ئەم مۆدێرنیزمە بۆ پاکژبوون بە نیسبەتی ئەو ژیانەی سەرچاوەی لێگرتووە، بە ناچار دەبێ توورە و سەڵت و بیچمنەگرتوو و تێکەڵ بە هەرا و زەنازەنا بێت. ئەم شێوە لە مۆدێرنیزم لە دژی خۆی ڕادەپەڕێ و خۆی ئەشکەنجە دەدا، چونکا ناتوانێ بە تاقی تەنیا مێژوو بگۆڕێ، یان لە پێناو لە کۆڵ کردنی تەواو باری قورسی مێژوو پەنا بۆ حەوڵە زێدەڕۆیانەکان دەبا (برمن، 1384: 283 و 284).

سوارە لە دوو قۆناغدا ئەو مۆدێرنیزمە ئەزموون دەکا واتە کاتێک کە بۆ چارەسەری نەخۆشی و بۆ دەربازبوون لە گوشاری هۆز و عەشیرە و درێژەدان بە خوێندن ڕوو لە

تەورێز و تاران دەنێ و بە باوەشی ئاوەڵاوە شار دەکاتە ئەو ئۆبژە رزگاریهێنەر و ئۆخژنهێنەرە کە دەتوانێ چارەسەری ئارەزووەکانی ئەو بێ و لە قۆناغی دووهەمدا و بە پشتبەستن بە رۆمانسیەتێکی دژەشارانە کە زۆرتر سەرچاوە لە بیری ئایدیالۆژیکی ئەو دەگرێت، شار دەکاتە سەرچاوەی سەرەکی تەواو نەهامەتی و زەبروزەنگ و بێزراوییەکان. کەچی بەمەشەوە هەر خودی ئەم بێزراوییە لایەنی دووهەمی حەز و تاسەی شارە و سەرچاوە لەو ڕۆحە ستایشگەرە دەروونییە دەگرێ کە شار لە رێگەی دیترهاوێژییەکانی ئاراستەی کردووە و وەک تاقە ماشینی مەیل تەواو بوونەکان (هەم بوونی تایبەتی و هەم بوونی بە کۆمەڵ) لە خۆیدا چڕ دەکاتەوە. یان باشتر وایە بڵێین ئەم شیوە بێزارییە لە فەزای شار و حەز بە گەڕانەوە بۆ ژیانێکی پاستۆراڵ، دوای گەشەسەندنی نیوەچڵانەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی دەرئەنجامی مێهرئاگینی حەز و بێزارییەکە کە سەرچاوە لە مۆدێرنیزاسیۆنی شاری گەورە دەگرێ و تێیدا دژکاران هاوکاتی ستایش کردنی فەرهەنگی بەرهەستی مۆدێرنیستی، لە ئابسترەی خۆیاندا وەک دژکاری و تێهەڵچوون و لێکهەڵبەزینەوەی دوو دڵدار، لە دژی دەوەستن و لە خەیاڵی خۆیان لە گەڵیدا تێهەڵدەچن:

گوڵم/ دڵم پڕە لە دەرد و کوڵ/ دەڵێم بڕۆم لە ***شارەکەت***/ ئەڵێم بە جامی ئاوی کانیاوی دێ/ عیلاجی کەم کولی دڵی پڕم/ لە دەردی ***ئینتیزارەکەت*** ... (ئیلخانی زادە: 27)

کەواتە ئەم ململانێ زەینییە بەشێکە لە ئەزموونی رۆژانەی ئەو جەماوەرە کە وەک بێرمەن دەڵێ: هاوکاتی دەرپڕینی بێزاری و توندی لە دژی شار، وێنەکەی بە دروەشاوەترین و پاکژێتیی تەواوەوە لە زەینی خۆیاندا وێنا دەکەن و جوانییەکی تایبەتی پێدەبەخشن (پێشوو: 207).

ئەمە لە راستیدا ئەو دژوازییەیە کە بە ڕوونی لە شێعری شاردا بەرچاو دەکەوێ، شێعرێک کە هاوکاتی وەسفی درەوشاوە لە خودی شار، وەسفەکەی لە پێناو بابەتی هاوچەشنی وەک لادێ و گوند رەفز دەکاتەوە و تۆ بڵێی بەردەنگی ئەم

شێعره هەر خودی شاره و شار خۆی وەک گوڵێک یان وەک عەشقێکی شێعری دەرکەوتبێ و شاعیر وەک غەمزەیەک بۆ شار باس لە چرای نیئۆنەکان و رەمزی ئاسن و مەناره و پەیکەره و دارتێل و جوانییەکانی دیکەی دەکا.
بەڵام بەوەشەوە شاعیر لەگەڵ هەر دێرێکی شێعری، گەڕانەوەیەکی زەمانی نەک وەک ڕابردوو، بەڵکوو وەک یادەوەری و ژیانێکی ڕابردوویی ئاوێتەی دێره شێعرییەکان دەکا و حەوڵ دەدا لە رێگەی ئەم یادەوەرییانەوە ئەزموونە بە لێشاوەکانی خۆی لە شوێنێکی تایبەتی زەمانیدا چڕ کاتەوە و لۆکاچ وتنی بە پشتبەستن بەم زەمانە خۆی لە پەرەتەوازەیی و نانیشتەجێتیی ترانسێندێنتاڵ رزگاری دەکا و لە رێگەی یەکپارچەکردنەوەی ئەزموونەکان لە ئەزموونێکی تایبەتیدا، ئیمکانی دەستەبەرکردنی ڕابردوویەک دەڕەخسێنێ کە تێیدا بە یارمەتیی ئەزموونێکی زیندوو وەک قووڵترین و ڕەسەنترین کەرەسەی زەمانی گشتییەتی، لێکهەڵوەشاوە سەریەکدەخاتەوە و زەینی بێخانوومان دەگەڕێنێتەوە بۆ یانەی خۆی (لەمباره بڕوانە؛ پارکینسون، 1375: 232-233)، یان بە گوێرەیەکیتر ئەزموونەکان لە رێگای ئەوزەمانە تایبەتە  ئیمکانی ئاڵوگۆڕکردنیان بۆ دەڕەخسێ.
کەواتە لە کۆتایی ئەم نووسراوە دەتوانین بە ڕاشکاوی بڵێین کە سواره یەکێکە لەو شاعیره بە توانایانەی ئەدەبی نوێخوازیی کوردی کە لە پێناو پرۆژەی بەردەنگ سازی بۆ شێعری نوێ، هاوکاتی حەوڵدان بۆ بەردەوامێتی نەریت و پاراستن و چەندپاتەبوونەی ئەزموونەکان، ئاوڕی لە ڕابردوویەکی ڕەسەن و نەک ڕابردوویەکی کاتناسانە داوەتەوە و لەو رێگایە ڕووبەڕووی هاوچەشنییەک لە هەنووکەدا دەبێتەوە کە تێیدا فەرهەنگی بەرهەست بەسەر فەرهەنگی زەینیدا سواره.
کەچی سواره نەک بە شێوەیەکی نۆستالۆژیک و گەڕانەوەخوازانە، بەڵکوو بە نامومکینکردنی خودی گەڕانەوە و ژیان لە ڕابردووی چەندپاتەکراوە، جۆرێک کەمایەسی و فوقدان دەخەملێنێ کە بە ناوچاوی ئەزموونی رۆژانەوە دیاره و پێویستە کە شێعری ئەمڕۆش بە ئاوردانەوە لە تاقیکارییەکانی ئەو و بە

هاوچەشن‌سازیی هەنووکە لەگەڵ کاتی یادەوەریی شاعیر، ئەزموونەکان بۆ دانوستانی بەردەوام ئامادە بکا.

**سەچاوەکان:**

1- ئیلخانی زادە، سوارە (1372)، خەوە بەردینە، ورمێ: سەلاحەدینی ئەییووبی
2- برمن، مارشال (1384)، تجربه مدرنیته: هر آنچه سخت است و استوار دود می‌شود و به هوا می‌رود، ترجمه: مراد فرهاد پور، تهران: طرح نو
3- بنیامین، والتر (1375)، قصه گو: تأملی در آثار نیکلای لسکوف، ترجمه: مراد فرهادپور و فضل الله پاکزاد، به نقل از فصلنامه ارغنون شماره 9 و 10، تهران: سازمان چاپ و انتشارات، وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی.
4- بنیامین، والتر (1377)، درباره برخی از مضامین و دستمایه های شعر بودلر، ترجمه: مراد فرهادپور، به نقل از فصلنامه ارغنون شماره 14، تهران: سازمان چاپ و انتشارات، وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی.
5- بنیامین، آندره (1377)، سنت و تجربه، ترجمه: فرزان سجودی، به نقل از نشریه: فارابی، شماره 31
6- پارکینسون، جی (1375). لوکاچ و جامعه شناسی ادبیات، ترجمه: هاله لاجوردی، به نقل از فصلنامه ارغنون شماره 9 و 10، تهران: سازمان چاپ و انتشارات، وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی.
7- ریچاردز، بری (1382)، روانکاوی فرهنگ عامه، ترجمه: حسین پاینده، تهران: طرح نو
8- سیوەیلی، ڕێبوار (2008)، نەتەوە و حەکایەت (بەرگی یەکەم)، هەولێر: دەزگای موکریانی
9- اشتاین، روبرت (1382)، والتر بنیامین، ترجمه: مجید مددی، تهران: اختران